# چـــۆن پێـــشـوازی
# لە مانگی ڕەمەزان بکەین ؟

نوسینی : باوکی عبداللە



دیزاینی بەرگ : محمد عبدالرحمن

بسم الله الرحمان الرحيم

پێشەکی: :الحمدلله القائل {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ }

**والصلاة والسلام علي من قال [من صام رمضان إيمانا واحتسابا غفرله ما تقدم من ذنبه ]**

**والصلاة والسلام علي من قال [من قام رمضان إيمانا واحتسابا غفرله ما تقدم من ذنبه]**

**والصلاة والسلام علي من قال [من قام ليلة القدر إيمانا واحتسابا غفرله ما تقدم من ذنبه]**

**وعلي أله وصحبه ومن صار على نهجة إلى يوم الدين~ أما بعد......**

ئەوەی جێگای داخ و پەژارەی موسوڵمانانە بە گشتی وە جێگای دلگرانی یەکخوا پەرستانە بە تایبەتی لاوازی و بیٚ هێزی و زەلیلی و شکانی ئوممەتی ئیسلامە لە گشت رووەکانی کە بە درێژایی مێژوو ئەم ئوممەتە دۆرانی وای بە خۆوە نەبینیوە لە کاتێک خاوەنەکەی پەروەردگاری بەهێزو کاربەجیٚ وداناو خێرایە وە پێشەواکەی رسول الله یە ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ کە بەهێزترین و سەرکەوتووترین پێغەمبەرو بەشەرە لەسەر زەوی وە خاوەنی جوانترین وتەواوترین دینە لەسەر زەوی کە *ئیسلامە* وە خاوەنی ڕێکترین وبەهێزترین وگشگیرترین کیتابە کە*قورئانی پیرۆزە* لەمەوە بۆمان بەدیار دەکەوێت زۆر بەرونی و ئاشکرا کە جێی گومان ناهێڵێتەوە لە دڵی هیچ عاقل و تێگەیشتوویەک کە هۆی سەرەکی دۆران و زەلیلی و فەقیری ئەم ئوممەتە تەنها ئێمەین شوێنکەوتەو هەڵگرەکانیەتی بە گشتی بە تایبەت ئەوانەی بەناوی حیزب وسیاسی ئیسلامی کاردەکەن وە بەتایبەتی[ئەمیرو براگەورەو زاناو بانگخوازو مامۆستاو مەلاکانی] جا تەنها چارەسەرو تاکە ڕێگای سەرکەوتن و گەرانەوەی ئەم ئوممەتە بۆ دۆخی راستەقینەی خۆی کە بەهێزی وگرتنە دەستی قیادەی جیهان بە گشتی و موسولمانان بەتایبەت ئەوەیە جارێکی تر سەر لەنویٚ تەوبە بکەین و خۆمان بەتەواوی بگۆرین لەهەموو رووەکان بەتایبەت دەستگرتن و جیٚ بەجێکردنی قورئان وسوننەت وەکوو خۆی و چۆن پەروەردگار ئەمری پێکردووین وە بەتێگەیشتنی هاوەڵە ڕستگۆو بەرێزەکانی رسول الله﴿صلى الله عليه وسلم﴾ کە گرنگترین و گەورەترین کار ئەوان دەستیان پێکرد بانگەوازیان بۆ کرد [تەوحید و یەکتاپەرستی خوای گەورەبوو] کە بەخاڵی سەرەکی و سەرەتایان دەزانی بۆ سەرکەوتن وبەختەوەری تاک وکۆی ئەم ئوممەتە، جا پەروەردگار بۆ ئاسانکردنی گۆرانکاری موسولمانان بەگشتی وە یەکخواپەرستی و ئەمیرو زاناو بانگخوازەکان بەتایبەت.

وەک ڕەحمەتێک مانگی پیرۆزو پڕ ڕەحمەتی ڕەمەزانی کردە هۆیەکی زەرورو پێویست بۆ گۆرانکاری تەواو، جا گۆرانکاریە پێویست وسەرەکیەکان کە دەبێت لەم مانگە بکرێت بەم شێوەیە... گۆرانکاری شیرک وکوفرە بەهەموو شێوەکانی لەهەموو ڕووەکانی بەتایبەت لەشیرکی گەورە کەلەو سەردەمە زۆرەو موسولمانان تووشی بوونە و بیٚ ئاگان لیٚی یان بیٚ ئاگایان دەکەن لیٚی بەشتیٚکی سووک وسادەی دەناسیٚنن لای خەلٚکی کەلە راستیە ئەسل وبنچینەو سیفاتیٚکی تایبەتی پەروەردگارە کە [شرکی حاکمیەت وتشریع وشویٚن کەوتنە] وە وازهیٚنان لەشرکی بچووک بەتایبەت[شرکی ریاء] کەوا لەهەموو گوناهە گەورەکان ترسناکترە،

ئینجا گۆرانکاری تەواو لەهەموو ڕووەکان وە بەهەموو بەشەکانی [ئەخلاق]ە بەراستی ئەوەی جیٚی ناشرینکردنی ئەم دینە بوو لای خەلٚکی پشت کردنی موسولمانانە لە ئەخلاقی جوان وبەرزو تەواوی رسول الله یە بەتایبەت[ئەمیرو زاناو بانگخوازو مەلاکان]، گۆرانکاری لە دلٚی پیس وبۆگەن ورەق ودونیا ویست و پڕ ڕق و قین بۆ دلٚیٚکی پاک و ساغ وساف وخواویست ونیەت پاک وخاشیع و ئاخیرەت ویست

خوشک وبرای ئیماندارو خۆشەویستم سویٚند بەخوا سەرکەوتوو نابین تا جاریٚکیتر بەجوانی وتەواوی[تەزکیەی نەفسی] خۆمان نەکەین وەک و پەروەردگار دەفەرمووی{قد أفلح من زكاها} ، گۆرانکاری لە وازهیٚنان لە بیدعە بەهەموو جۆرەکانی بەتایبەت بیدعەی عەقیدی وبیروباوەر وەک [بیدعەی مورجیئەو خواریج وموعتەزیلەو ئەشعەری وعەقلانی وباقی کۆمەلە گومراکانی تر] کە لایان داوە لەبەرنامەی ئەهلی سوننەو جماعە،،،وە بیدعەی عەمەلی وەک و[زیادکردن لەنویٚژ لە زیکر لە ڕۆژوو لەقورئان خویٚندن ]وە تایبەت لە وەسائیلی دەعوەو بانگخوازی.

گۆرانکاری لە نویٚژە بیٚ نازەکانمان لە نویٚژە بیٚ خشوعەکانمان لەو نویٚژانەی هیچی لەکاتی خۆی ناکریٚت وە بەتایبەت گۆرانکاری لە نویٚژی بەیانی کەوا زۆری موسولمانانی ئەم سەردەمە نایکەن * بۆ نویٚژیٚکی ئیمانی نویٚژیٚکی پڕ لەخشوع نویٚژیٚک پاریٚزەر بیٚت لە گوناح وفاحیشەو دووروویی * گۆرانکاری لە ترسنۆکی ودونیاویستی بۆ ئازایەتی و دونیا نەویستی ، گۆرانکاری لە خواردن وکڕین وفرۆشتن وپارەی حەرام بەرەو خواردن وفرۆشتن وپارەی حەلاٚل.....

گۆرانکاری لەزولٚم کردن وبەگویٚ نەکردنی دایک وباوک بەرەو ریٚزگرتن و چاکە کردن و خزمەت کردنی دایک و باوک،،گۆرانکاری لەزولٚم و ریٚزنەگرتنی خیٚزان و منالاٚن بۆ چـــــــاکبون وریٚزلیٚنانیان و نــــــەرم و نیانی لـــــــەگـــــەلٚیان.....

گۆرانكاری لە ڕیاو خۆدەرخستن و خۆ بەگەورە زانین وحەزكردن بە ناو دەركردن و ناو گەورەكردن ،، بەرەو ئیخلاص ونیەت پاكی وزەلیلی وخۆبەكەم زان بەرامبەر پەروەردگار ،،، گۆرانكاری لە مۆبایل و ئەنتەرنێت و تەلەفزیۆن،،، بۆ خەریك بوون و كات سەرف كردن لەكاری خێرو قیامەتی،،، گۆرانكاری لە جەهل و نەزانین وبێ ئاگایی لە زانستی شەرعی بەتایبەت[عقیدەو بیروباوەرو یەكتا پەرستی] بۆ خۆ شارەزاكردن لە زانستی شەرعی بەتایبەت ئەوانەی واجب وپێویستە هەموو ژن و پیاوێكی موسولمان بیزانێت وەك [ناسینی پەروەردگار وەك وخۆی و بەهەموو شێوەو جۆرەكانی، وەناسینی پێغەمبەر[صلى الله عليه وسلم] بەتایبەت ئەوەی كە پێی هاتووە بریتیە لە تەنها یەكخواپەرستی خوای گەورە]،،، وە ناسینی دینی ڕاستەقینەی ئیسلام بەوشێوەی كە هاتووەو خوای گەورە پێی خۆشەو پێی ڕازیە بە تێگەیشتنی هاوەڵانی رسول الله[صلى الله عليه وسلم]،،، گۆرانكاری لەخەم نەخواردن و سەرنەخستنی دینی ئیسلام و تەوحیدی پەروەردگار ،، بەرەو هەست كردن بە مەسئولایەتی بەرامبەر دینەكەمان بەتایبەت ببینە سەربازێكی ڕاستەقینەو تەواوی سەرخەری تەوحیدو بەرنامەی ئەهلی سوننەو جماعە ،،، گۆرانكاری لەكەم تامەزرۆییمان لەبەهەشت وكەم ترسیمان لە قەبرو قیامەت ودۆزەخ ،،، بەرەو گروتین و تامەزرۆییەكی زۆرو بێ سنور بۆ بەهەشت و ترسێكی تەواوو زۆر لە مردن و قەبرو قیامەت و دۆزەخ،،،

گۆرانكاری لە قسەی گەورەو نەستەق و بریقەو باق ،،، بۆ كردەوەو بەرنامەو عیبادەت و مشروعی گەورەو جوان و گرینگ و بەرهەمدار.....

گۆرانكاری لە ئیمانی نەزەری و زمان بۆ ئیمانێكی جێگیرو تەواوو پتەو بەرهەمدار كە پێك هاتبێت لە [دڵ و زمان و كردەوە]... گۆرانكاری لە نیەت و تەسكی دەعوەمان لە حزبایەتی وشەخس پەرستی و سیاسەتی دونیەوی و كۆكردنەوەی خەڵك لە خۆمان بۆ بانگكردنیان وناسینی پەروەردگاریان * بانگكردنیان تەنها بۆ یەكتا پەرستی پەروەردگار شارەزایان بكەین بەوەی پەروەردگار تەنها زاتی پیرۆزی دروستكارو بەرێوەبەرو رازقی هەموو جیهانە وە تەنها ئەم زاتە حەقی پەرستنی هەیە لە هەموو رووەكانی عیبادەت كە پەروەردگار تەنها بۆ ئەوە دروستی كردوین بیپەرستین شەریكی بۆ بریار نەدەین لە پەروەردگارێتی و پەرستن و ئەسمائوو سیفات و حوكم و تشریعەكەی...

گۆرانكاری لە تەرك كردنی درۆو بە فیرۆدانی ئەمانەت وپێشێل كردنی وەعدو پەیمان ،،، بەرەو راستگۆیی تەواوو پاراستنی ئەمانەت و بەجێ گەیاندنی وەعدو پەیمان لەكاتی خۆی گەر عوزری شەرعی نەبوو....

گۆرانکاری لە سفوری و حیجابی تەسک و برۆکردن و قسەکردن لەگەل پیاوی خەلک،،بۆ حیجاب و نیقابی شەرعی بۆ شەرم و حەیای تەواو لە پەروەردگار دوایی لە پیاوی بێگانە،،،

گۆرانکاری لە دلّی ڕەق و پیس بۆ دلێکی نەرم و پاک و ساف و دوور لە ڕق وقین،، گۆرانکاری تەواو لە گوناحی دلْ ولاشەو زمان،،، بەرەو عیبادەت و چاککردنی دلْ ولاشەو زمان.....

## خوشک وبرای ئیماندارم باش بزانن رەحمەتی خواتان لێبێ...

رەمەزان فرسەتێکی زۆر گەورەو گرینگ و خێرایە بۆ کەسی راستگۆو خەمخۆر لەقەبرو قیامەتی رەمەزان قوتابخانەی ژن وپیاوی ئیمانداروو مەردە کەوا چەندین ژن وپیاوی گەورەو ئیماندار لەم قوتابخانەیە دەرچوونە بونەتە رەحمەت و هیدایەت و بەرەکەت بۆ ئیسلام و موسولمانان ....

بۆیە شاعیر دەفەرموویێت...

**هنا مضع الأبطال... يضع أمة ــــ وينفخ فيها قوة الروح والفكر**

**ويخلع عنها كل قيد يقوعـــها ــــ ويعلي منار الحق والصدق والصبر**

شتێکی دیارو زانراوە لاتان پیاوە گەورە راستگۆکانی ئەم ئوممەتە کە هاوەلّەکانی پێغەمبەرن[صلى الله عليه وسلم] لەم مانگە چ داستانێکیان تۆمارکرد چۆن مێژوی شرک و بتپەرستی [لات وعوززاو مەناتیان] گۆری بۆ مێژوی پڕ خێرو بەرەکەت و پرشنگداری تەوحیدو یەکخواپەرستی، کەوا لە حەقدەی رەمەزان جەیشی موەحیدین سەرکەوت بەسەر جەیشی موشریکین وەکوو خوای گەورە دەفەرمووێ { وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنْتُمْ أَذِلَّةٌ ۖ فَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ }(Aali Imraan :123) ...

وە شاعیر دەلێت ـــــ

**أبطال بدر يا جباها شُرعَت ــــ للشمس تَحكي وجهها المصقولا**

**مطحتم الشرك المصفر خده ــــ فارتد مشلول الخطى مخذولا**

جا با قۆلّی خۆمانی لێهەلّمالێین بۆ ئەوەی لەو دەورە مانگیە ببین بە لەخوا ترسی تەواو ببینە سەرخەری بەدرو فتح و لەناو بەری تەتارو گشت دوژمنانی پەروەردگارو ئەهلی تەوحید ... فرسەتە ئەهلی ئیمان ـ رەحمەتە ئەهلی ئیمان ـ بەرەکەتە ئەهلی ئیمان ـ هیدایەتە ئەهلی ئیمان ـ دەورەو پێگەیاندنی ئەهلی ئیمانە ......

ئیلاهی پەروەردگار بۆ خاتری ناوی جوانت سیفاتی بەرزت لە ڕەحمەت و بەرەکەت و هیدایەت و لێخۆشبوونی ئەم مانگە پیرۆزە بێبەشمان مەکە * ئیلاهی بیکە دووبارە بونەوەی بەدرو فەتح و تێکشکانی تەتارو دوژمنانی زاتی پیرۆزت * ئیلاهی بمان کە ئەهلی قورئان بەتایبەت لەو مانگە * ئیلاهی فیردەوسمان بە نسیب بکەو لە دۆزەخ بمان پارێزە * ئیلاهی ئیخلاێ و نیەت پاکیمان پێ ببەخشە لەهەموو قسەو کردەوەک لەهەموو کات و ساتێک * ئیلاهی پابەندمان بکە بە سوننەتی پڕ ڕەحمەت و هیدایەتی پێغەمبەرمان[صلى الله عليه وسلم] أمين أمين أمين والحمد لله رب العالمين

باوکی عبدالله

رەمەزانی
١٤٣٩ک

## چۆن پێشوازی بکەین لە مانگی ڕەمەزان؟

یەکەم شت ئامادەکردنی دڵ بۆ مانگی رەمەزان چونکە رەمەزان مانگێکی گەورەیە پێغەمبەری خوا دەفەرمووێ {لەمانگی رەمەزان دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە وە دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن} واتە کرانەوەی دەرگای گوێڕایەڵی چاکە کە دەتگەیەنتە بەهەشت هەروەکو ئەوە وایە کە پێغەمەری خوا پێت بڵێ دەست بگرن بەو دەرگایانە چونکە ڕێگای چونە بەهەشتە بە ئیزنی خوا ....

## چۆن دڵت ئامادە دەکەی بۆ ڕەمەزان ؟

دڵ بزوێنەری ئینسانە چونکە دڵ پاشای ئەندامەکانە رسول الله دەفەرموێ{اذا صلحت صلح جسد کله و اذا فسدت جسد کله ألا وهي قلب} چونکە ئەگەر دڵ چاک بێ ئەوا زمان و تەواوی کردەوەکان چاک دەبن ئەمەش بەچی دروست دەبێ بە دڵێکی تەندروست [قلب سليم]، بزانە رەحمەتی خوات لێبێ رزگاربوون لە دونیاو قیامەت بە دڵێکی تەندروست و پڕ لەترسی الله سبحان وتعالی دەبێ ئەمەش خوای گەورە لە کتێبە پیرۆزەکەی باسی کردووە دەفەرمووێ{يَوْمَ لَا يَنْفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ (Ash-Shu'araa :88)

ئەو ڕۆژە کە نەماڵ سوود دەداو، نەمنداڵ و کوڕان بە کەڵك دێن (تەفسیری ڕامان) إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ (Ash-Shu'araa :89)

{إلا من أتى الله بقلب سليم} مەگەر کەسێ کەبە دڵێکی ساغەوە بێتە حزووری خوا، ساغ بوو بێت لە نەخۆشی شیرك و نیفاق و دووڕوویی و سیفاتی درندەیی و ئاژەڵیی، خۆیشی تەنها بەخواوە پەیوەست کردبێ و هەر لەگەڵ بەرنامەی ئەودا کاری کردبێت، وە لە مانای (لا إله إلا الله) نەترازابێت، زاناکان پێناسەی (قەلبی سەلیم) ئەکەن: (هو القلب الخالي من البدعة، المطمئن على السنة) بیدعەچی نەبێ و، دامەزراوو مەحکەم بێت لەسەر سوننەت و ڕەوشتەکانی پێغەمبەر ([S])؛: (تەفسیری ڕامان).

ئەی ئەو کەسەی لە مانگی رەمەزان بەرۆژوو دەبی خۆت دەگریەوە لە هەموو خواردن و خواردنەوەیەک لەگەڵ ئەوەش لە ناو حزبێکی عەلمانی ئیش دەکەی دیفاعی لێدەکەی و بووی بە پارێزەری بەرنامەکەیان کە عەلمانی دژی ئەهلی تەوحیدە، ئامۆژگاریت دەکەم بەوەی تەوبە بکەی لەو رەمەزانە بزانە رەمەزان مانگی فرقانە مانگی مەغفیرەتە واتە جیاوازی لە نێوان بەرەی ئیمان وکوفرە بەرەی اولياء الرحمن لەگەڵ اولياء الشيطان ، بزانە رەحەتی خوات لێبێ لەلای الله سبحان وتعالی تەنها بەرنامەی ئیسلام قبوڵە الله دەفەرمووێ{ وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ (Aali Imraan :85)

{ومن يبتغ غير الإسلام دينا فلن يقبل منه} هەرکەسێ بێجگە لەبەرنامەو شەریعەتی ئیسلام هەردینێك بۆخۆی هەڵبژێرێ و بیکا بەبەرنامەی خۆی هەرگیز لێیوەرناگیردرێ {وهو في الآخرة من الخاسرين} و لەدوارۆژیشدا لەریزی زیانمەندانە.(تەفسیری ڕامان)

# چۆن ببین بە ئەهلی قورئان لە رەمەزان؟

من یان تۆ کاتێک دەبین بە ئەهلی قورئان کاتێک دڵمان پڕ ئەبێ لە تەوحید پڕ دەبێ لە الولاء وبراء کاتێک پڕ دەبێ لە خۆشەویستی شەریعەتی ئیسلام ئەوا دڵ پڕ دەبێ لە خۆشەویستی خوا سبحان وتعالی،

کاتێک ئەبی بە ئەهلی قورئان وەک صحابە رضي الله عنه أجمعين دەبێ بزانین چۆن قورئانیان خوێندووە وەک و ابن مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێ ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ فێری قورئان دەبووین دە ئایەت دە ئایەت وەرمان دەگرت پاشان بیرمان لێ دەکردەوە وە حەرام وحەلاڵمان لێک جیادەکردەوە وە ئینجا دەگەڕاینەوە بۆ وەرگرتنی چەند ئایەتێکی تر لە قورئان ،،، بزانە رەحمەتی خوات لێبێ قورئان بۆ ئەوە هاتووە بیری لێبکەینەوە نەک بەس بیخوێنینەوە الله سبحان وتعالی دەفەرمووێ {كِتَابٌ أَنْزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ (Saad :29)

{كتاب أنزلناه إليك مبارك} ئەمە کتێبێکە پیرۆز، دامان بەزاند بۆ تۆ ئەی موحەممەد ا([S]) {ليدبروا آياته} تا ئەوانە لەئایەتەکانی رابمێنن {وليتذكر أولوا الألباب} و فامیدەو ژیرەکانیش ئامۆژگاری لێوەرگرن . (شێخ حەسەنی بەصریی) دەڵێت: سوێندم بەخوا لەبەرکردنی گشت پیتەکانی هەموو قورئان و، پشتگوێ خستنی مەبەستەکانیشی تەدەبوور و تێفکران نییە، هەندێ کەس ئەڵێ: ئەمە سوێندی بێت تەواوی قورئانم لەبەرەو تەنها پیتێکم لێنەپەڕاندووە، بەڵام ئەگەر ماناو داواکارییەکانی پشتگوێ خستبێ، سوێند بەخوا ئەوکەسە هەموو قورئانی پەڕاندووە و پشتگوێی خستووە!. (تەفسیری ڕامان)،،،

قال علي إبن طالب [رضي الله عنه]{ لا خير في عبادة لا فقه فيها ولا في قراءة لا تدبر فيها}واتە خێرو چاکە نیە لە عیبادەت و خواناسیەک دا بە فقە شارەزاییەوە نەبێت ،خێریش نیە لە قورئان خوێندنەوەیەکدا وردبوونەوەو بیر لێکردنەوەی بەدوا نەیەت.

وە هەروەها ئیمام ابن جرير طبري دەفەرمووێ [عجبت لمن يقرأ القرأن ولا يفهم معناه كيف يتلذ بتلاوة ]واتە پێم سەیرە کەسێک قورئان دەخوێنێت وە لە ماناکەشی ناگات چۆن تام ولەزەت لە قورئان دەکات ، خۆشەویستان دەزانن کێشەی ئێمە لە کوێدایە قەرائەی قورئانمان هەیە بەڵام مومارەسەی قورئانمان نیە بە داخەوە .

چۆن بەقورئان بژین؟ مامۆستای خۆشەویست سەید قوطب رحمه الله [الحياة فى ضلال القران نعمه لا يعرفها إلا من ذاقها] ژیان لە سێبەری قورئان نیعمەتە کەس نایچێژێ ئەو کەسە نەبێ کە چێشتبێتی رەحمەتی خوای لێبێ بۆ قورئان ژیا وە بۆ قورئانیش مرد، هەروەها ئیمامی [ابن جریری طبری]رحمه الله دەفەرمووێ {عجبت لمن يقرأ القرآن ولا يفهم معناه كيف يتلذ بتلاوة}پێم سەیرە کەسێک قورئان دەخوێنێت وەلە ماناکەشی ناگات چۆن تام ولەزەت لە خوێندنەوەی قورئان دەکات ، {عبدالملک کوری شیب لە یەکێک لە نەوەکانی [ابن ابی لیلی]دەگێرێتەوە دەڵێت بەسەردان چووم بۆ مالی خوشکێکی موسولمان کاتێک چومە ژوورەوە بەدەم خۆمەوە سورەتی هودم دەخوێندەوە کاتێک ئەو ئافرەتە گوێی لێ بوو سەرسام بوو لەو قورئان خوێندنە وشکەیی و بەسەرسامیەوە پێی ووتم ئەی عبدالرحمان تۆ هەمیشە بەم چەشنە سورەتی هەد دەخوێنی؟واتە بەپەلەو بێ ئەوەی بیر لە وشەکانی بکەیەوە دەی سوێند بەخوا من شەش مانگە لەو سورەتەدام هێشتا تەواوم نەکردووەو لێی دەرنەچوومە} ئەم قورئانە خودای سبحان وتعالی کردیە گەورەترین عەلامەت لە نێوان خۆیی و خۆشەویستی بەندەکانی بەلاّم خودای گەورە پێمان دەلّێ گەر منتان خۆش دەوێت بۆچی پشتتان لە کەلامەکەم کرد پشتتان لە خوێندنەوە نا چونکە خەڵکی سەرجادەکانیش دەخوێننەوە بەلّکو جاری واهەیە خەڵکی زۆر فاسد هەموو قورئانی لەبەرە بەلّکو شەش ملیۆن یەهودی قورئانی لەبەرە تەفسیریش دەزانن بەلاّم چ ئیسفادەی لێدەکەن بۆیە [حەسەنی بتصری] لەتەفسیری ئەو ئایەتەی کە دەفەرمووێ{ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ أُولَٰئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ (Al-Baqara :121) ئەو کەسانەی کە کەلامی خوا دەخوێننەوە دوایی ئیمانی پێ دەهێنن ئەوانە باشترین کەسن [حەسەنی بتصری] رەحمەتی خوای لێبێ ئەوە ئەو کەسانە دەگرێتەوە یەک ئایەتیان نەخوێندەوە لە کیتابی خودا بەلاّم خودا بەرزی کردنەوە لەبەر ئەوە دابەزیوە تەنها ئینسانەکان هیدایەتی پێوەرگرن وە بەرەکەت بێ وە ببێتە شیفا و نوور بۆ دلّەکان، چونکە کەلامی خودا وەک و ئەو تابعیە بەرێزەی کەلەسەرە مەرگ بوو کورەکەی دەگریا ووتی کورم

بۆخۆت بگری باوکت هەژدە هەزار خەتمی کردووە جا خەتمی سەلەف لەگەڵ خەتمی ئێمە رۆژهەڵات و رۆژئاوای فەرقە ئەوان ئایەتەکانی خودای پەروەردگاریان دووبارە دەکردەوە لەبەرئەوەی ئەو ئایەتانە بەتایبەتی ئەو ئایەتانەی باسی قیامەت دەکات زۆر دووبارەیان دەکردەوە تاوەک و تەدەبوری لێبکەن بۆیەش وا هەست نەکەین کەوا ئێمە بەرۆژێک ئەو خشوعەمان دەست بکەویٚ بەڵکو دەبیٚ بەردەوام بین ڕۆژێک هەفتەیەک یان مانگێک بەردەوام بین تاوەک و تەواو تەواو ئەم خشوعەمان بۆ دروست دەبیٚ بۆیە هەریەکێک لە ئێمە بە راستگۆیی لە ئێستاوە هەتا رەمەزان خەریکی ئەو تەدەبورە بێت رەمەزان یەک پارچە ئیمان و یەک پارچە رەحمەت دەبێت بۆی بەئیزنی خودای پەروەردگار، بۆیە هەدەف و کلیلی یەکەمی تەدەبوری ئەو قورئانە ئەو دڵەیە کەباسمان کرد {**إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ** (Qaaf :37) کەواتە زمانی تەجوید هیچ کێشەی نیە هیچ خشوع لەدڵت دروست ناکات با وەکو پێغەمبەر بخوێنیت با دەنگت وەکو پێغەمبەر[داود] سەلامی خوای لێبیٚ خۆش بێت وەالله ئیمان بەقەدەر ئەو نینۆکە بچوکە لە دڵت دروست نابیٚ هەتا بەدڵ نەیخوێنیت، کاتێک بمانەویٚ ئیستیفادە لە کەلامی خەدا بکەین وەکو ئەو چیایەی دەتاوێتەوە لە کەلامی خودا دڵمان ئەوها بتاوێتەوە دڵی خۆمان دەبێت بدەینە قورئانەکەی خودای گەورە بزانن دڵدانیش بە قورئان ئەوها دەبیٚ بەتەفسیل بچینە سەری دەبیٚ دڵمان پاک بێت لە ڕیاء بە دەرەجە یەک ئەوە یەکەم خاڵی دڵی سەلیمە نابێت ڕیایی تێدابێت نابێت خۆشی دونیای تێدابێت نابیٚ کاتێک کە قورئان دەخوێنین بۆ ئەوە بێت خەڵک بڵیٚ دەنگی خۆشە پەنا بە خودا ،

ئەو ڕۆژە بیری ئەو دۆستەم خستەوە کەوا هەموو جار بەیەکەوە دەچووینە مزگەوت کە ئەگەشتینە بەرامبەر ئیسکان رام ئەگرت دەم ووت راوەستەو سەیریکی دەستی چەپت بکەوە وا هەست مەکە کەوا ئیسلام تەنها کە شەهادەت هێناو بلێی تەواو هەتا مەلەکوت مەوت دێت ئیسراحەتم وهیچ کێشەم نابیٰ بەبیٰ شەک لەگەورەترین موشکیلەکانی ئێمە ئەوەیە[أفاةُ علي الطريقْ] ە یەعنی لەبابی ئەوەی کە خودای گەورە لەسورەتی فاتحە ئەفەرمووی[إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (Al-Faatiha :5)) ئەسباب هەیە بۆ هیدایەت وە ئەسبابیش هەیە بۆ غیوایەت وە یەکیک لەو ئەسبابە گەورانەی کەخودای گەورە کردیە هیدایەت بۆ دڵەکانمان تێگەیشتنمان هەبێت بۆ قورئان وە هەدەف لەقورئانەکەش ئەوەیە کە ئینسان ئەدەب وریز بکات لە کەلامەکەی خوای پەروەردگار وە یەکیک لەگرنگترین لەو نیشانانەی کەوا ئینسان بیریان لیٰ بکاتەوە ئەوەیە {گریانە لەترسی خوای پەروەردگار}، بۆیە ناونراوە عیبادەتێکی بزر وە ناویش لەو کەسانە نراوە کە لەترسی خوای پەروەردگار دەگرین بلێن ئەوا ئەوکەسە لە کەرامەت تێپەرێنێت بلێن موعجیزەیە لەو سەردەمەی کەسێک لەترسی خوای پەروەردگار بگرییٰ وە بەتایبەت ئەو ئایەتانەی کە خوای گەورە باسیان دەکات کە فەرقی نێوان دونیاو قیامەت چیە ، کاتێک ئینسان دەچێتە قیامەت خوای گەورە دەفەرمووی﴿يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ الدَّاعِيَ لَا عِوَجَ لَهُ ۖ وَخَشَعَتِ الْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا (Taahaa :108) بۆ لەقیامەت ئەوها خاشیع دەبین بۆ ئینسان لە قیامەت ئەوەندە لە خوا ترس دەبیٰ بۆ ئینسان ئەوەندە لەقیامەت گورج وگۆڵ دەبیٰ ئەوها بێدەنگ دەبیٰ کەس ناتوانیٰ غەلەت بروا بۆ لەقیامەت دایک وباوکی خۆمان لەبیر دەکەین ، ئەی ئینسان ئەی لەدونیا هەر ئەونەفسەت نیە قیامەت باس نەکراوە بۆت ئەزانن ئێمە چۆن لەدونیادا وەک وقیامەن دەژین ؟ ئەویش ئەوەیە کە لەئیسلام تێبگەین بەهەرسیٰ بەشیەوە کە ئەوانیش بریتین لە{ئیسلام ، ئیمان ، احسان} ئا لەبەر ئەمەیە لەقیامەت ئەم تەقوایەمان بۆ درووست دەبیٰ چونکە ئەوکات بەچاوی خۆمان دەیبینین، دەزانن پێناسەی حسان چیە{أن تعبد الله كأنك تراه فإنك إن لا تراه فإنه يراك}، کاتێک بەندە گەشتە پلەی احسان هەموو کاتێکی وەک وئەوە دەبیٰ کە عولەمایان دەفەرموون واللە ئەگەر ئایەتەکانی خوای پەروەردگار لە هەر دڵێک بێت ئەو دڵە پر دەبیٰ لەخەشیەتی پەروەردگار سوفیانی ثەوری ئەفەرمووی{صدع هذا القلب}.

ئەم دیینە نیعمەتێکی زۆر گەورەیە سبحان اللە پیاوی وەک و{توفەیل وجوبەیری کوری موطعتم}دەفەرموون گوێمان لیێبوو کاتێک پێغەمبەری خوا [ص]سورەتی {طور}ی دەخوێندەوە وەک ئەوە وابوو دڵی ئەفری بۆ ئاسمان، دەی باشە ئێمە ئەم هەموو

قورئانە دەخوێنینەوە بۆ دڵەکانمان بەرەو ئاسمان نافڕێ کە قورئان کەلامێکی زۆر گەورەی خوای پەروەردگارە ڕۆژانە لەهەموو دوونیا خەڵک بەهۆیەوە موسوڵمان دەبێ، بەڵام بەداخەوە زۆر جاریش سبحان الله کافران ودوژمنان وموستەشریقین بیرمان دەخەنەوە وەکو کابرای فەیلەسوفی ئەڵمانی پێمان دەڵێن ئێوەی موسوڵمانان ئەم قورئانە عەزیمەتان لەبەر دەستە ئێمە ناوکەکەی دەخۆین و ئێوەش پەلکەکەتان لەبەردەست ئەمێنێتەوە.

کەلامی خوای گەورە شیفایە بۆ هەموو دڵەکان بۆ هەموو نەخۆشیەکان، بۆیە بیرکردنەوە لەنزیک بوونەوە لەمانگی رەمەزان زۆر گرنگە زۆر گەورەیە بۆیە رەمەزان دووسێ هەدەفی زۆر زۆر گەورەی هەیە یەک لەو هەدەفە گەورانەی کە خودای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەی بۆمان باس ئەکا دەفەرمووێ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ** ](Al-Baqara :183) بۆیە ئینسانی موسوڵمان بۆ ئەوە بەڕۆژوو دەبێت کە تەقوای خوای بەدەست بێنێ ئەمە یەکێک لە هەدەفە گەورەکانی ڕۆژووە ، وە خوای گەورە بۆچی دەفەرمووێ ببن بە موتتەقی چونکە ئەو قورئانە کاتێک ئیستیفادەی لێدەکەیت کاتێک موتتەقی بیت دڵت پڕبێ لەتەقوا دڵت پڕبێ لە ئیخلاێ پڕبێ لە زووهد ودونیا نەویستی دڵت پڕبێ لەخەشیەی خوای گەورە بەتایبەت لە خەشیەی غەیب ئەوانەی کەبەتەنیان لەخوا دەترسن ئەو خاڵە زۆر گرنگە لەسەری پەروەردە بین ئەو کاتەی بەتەنیاین بەقەدەر حەوت تەبەقەی ئاسمان زیاتر لەخوا ترس بین بەبەراورد بەو کاتەی دێتە بەرچاوی خەڵک بۆیە الله **سبحان وتعالی دەفەرمووێ**﴿**إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ بِالْغَيْبِ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ** ﴾(Al-Mulk :12)، ئێستا هەرچەندە بگرین بەشی بەحرەکانی دوونیا ناکات یەک فرمێسک بەتەنیایی لە پێناو خودای گەورە بڕژێنین ناکاتە تەنها یەک فرمێسک یاخود یەک سبحان الله لە کاتی تەنیایی دا، موقابیلی هەزاران سبحان الله یە کەلە ناو خەڵکی دا ئەنجامی بدەین ، هەر لەبەر ئەم حیکمەتەشە شەونوێژ ئەو هەموو فەضلەی هەیە ئەمەش بە ئیخلاص دەست دەکەوێ کە ئینسان موخلیص بێ بۆخودا وە عیبادەتی قەلبی زیاتر بێ لە لاشەی وە عیبادەتی ماڵەوەی زۆرتربێ لە عیبادەتی دەرەوەی.

ناکرێت لەدەرەوە دڵت زۆر نەرم بێ لەماڵەوەش دڵت وەک چیا وابێ پەنا بەخوای گەورە ئەمە سیفاتی ئینسانی ئیماندار نیە، پەروەردگار لەرەمەزاندا هەدەفێکی تری هەیە ئەویش ئەوەیە الله دەفەرمووێ{**شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَىٰ وَالْفُرْقَانِ**} .

لەبەر چی پەروەردگار قورئانی لە رەمەزان دابەزاند؟ئەم شتانە زۆر گرنگە ئینسانی موسولمان بیزانێ لەبەر چی صحابة[رضی الله عنه] بە دە ئایەت ئەم پیاوە عەزیمانەیان لێ دەرچوو لەبەر چی ئێمە شەوو رۆژ قورئان دەخوێنین بەو شێوەیەی کە پەروەردگار ئەیەوێ وا درووست نابین الله عز وجل لەو ئایەتەدا دەفەرمووێ{لَوْ أَنْزَلْنَا هَٰذَا الْقُرْآنَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُتَصَدِّعًا مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ ۚ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ} (Al-Hashr :21) ئێوە بەس تەرکیز بخەنە سەر ئایەتەکان بزانن قورئان چەند نیعمەتێکی گەورەیە پەروەردگار لەقورئان باسی تەجوید ناکا باسی [خەشیە] دەکات دەبێ دڵ قورئان بخوێنێ هەتاوەک وخەشیەی خوای گەورەی بۆ درووست دەبێ بۆیە [فوضەیلی کوری عیاذ]ئەڵێ لە مەغریب بووم ئەو ئایەتەم خوێند کەوتم بە زەویدا وە گوێم لەدەنگێکی زۆر گەورەبوو کە سەلامم داوە بینیم کورەکەمە لەماڵیش زۆر لێنەدەکەرا گوێی لەقورئان بێ ئەزانن بۆچی چونکە سەلەف دڵیان تەحەمولی قورئانی نەدەکرد بەڵام سبحان الله بۆ دڵی ئەوخەڵکە ئێمە ئەوە چەند کاتە باسی قورئان دەکەین باسی ئایەتەکان دەکەین بەڵام پاش چەند کاتێکی کەم کەسمان لەبیرمان نامێنێ بۆیە دیین شتێکی عەمەلیە دین شتێک نیە یەکێک بێت قسەیەکی چاکت بۆ باس بکات ئەوا وابزانی ئەو کەسە کەسێکی موتتەقیە، نا نەخێر ئەوە قیاس نیە بۆ قسەکردن چونکە هەیە خوا زمانی قسەکردنی پێداوە بەڵام مەرجە ئەو کەسە لە قسەکردنی لەرۆژووی لە کرین وفرۆشتنی مەرجە کاتێک کەقورئان دەخوێنێ کاتێک شەونوێژ دەکات مەرجە تۆ لەوکاتانە عەمەلت ئەوها شیرین بێت نەک قسەکردنت بۆیە با بەوە هەڵنەخەڵەتێین یەکێک قسەیەکی کرد جارجار دڵی نەرمبوو فرمێسک بەچاوی داهات وابزانین ئەم کەسە قۆناغێکی زۆری بریوە ئەمە شتێکی زۆر هەڵەیە ئینسانی بروادار بگاتە ئەو حەددەی.

بەڵام ئەوەی جێگای پرسیارە ئەبێت پرسیار لەخۆت بکەیت پێش ئەوەی رەمەزان بێت ئەم رەمەزانە نیعمەتێکی زۆر عەزیمە الله سبحان وتعالی ئەیدات بەئێمەی موسوڵمان، بۆ موسوڵمانان بۆ فۆرماتی ئیمانە بۆ فۆرماتی دڵی خۆمانە تاوەک ودڵەکانمان پاک بێتەوە بەڵام خودای گەورە ئەفەرمووێ{أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا] (Muhammad :24) بۆیە دەبێت هەمووومان بێین پرسیار لەخۆمان بکەین ئایا دڵەکانمان چ قوفڵێکی پێوەیە ئایا قوفڵێکە یان چەند قوفڵێک قوفڵی ریاء یان حوببی دونیا یان شەهەوات یاخود شبوهات قوفلی کیبر یان حەسادەت ئەمانە هەمووی قوفڵن کە رێگا نادەن ئینسان تام وچێژ لە کەلامی پەروەردگار وەرگرن بەراستی ئەم قورئانە نیعمەتێکی زۆر گەورەیە کە ئێمە لێی مەحروومین ،

بۆیە کاتێک ئایەتێکیان بە ئەعرابیەک دەوت لە مەککە کە الله عزوجل دەفەرمووێ{ وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ (Adh-Dhaariyat :22) دەیوت بەسە یەک ئایەت بەسە دەڕۆیشتەوە ماڵەوە نەدەگەڕایەوە دوای یەک ساڵ دەگەڕایەوە بەیەک ئایەت دوازدە مانگ ئیمانی بەرزدەبۆوە ئێمە لە دانیشتنێکا سبحان الله ئەو ئایەتەی دەفەرمووێ {يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ (Al-Mutaffifin :6) دەخوێنین دەزانن بۆ دڵی ئێمە هیچ تەئسیری لێناکات لە پێشەکی باسمان کرد ووتمان هەربەندەیەک ئەوسێ ئایەتەی سورەی فاتیحە لە دڵی دا جێگیر نەبێ ئەوا عیبادەتەکانی {فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُورًا (Al-Furqaan :23) ئاخیر حەددی موجەررەد ئەجری بۆ دەمێنێتەوە، [ابن عاشور] رەحەتی خوای لێبێ دەی فەرموو ئەوە موقوددیمەیە ئەو سێ ئایەتە چونکە هەرکەسێک سەرەتاکەی مەزبوت نەبێ ئەوا ئاخیریشی مەزبوت نابێ .

واتە کاتێک تۆ دەتوانی ئەم قەرارە بدەی ئەوا ئەم بەندەیە خوای گەورەی ناسیبێت ئێمە کێشەمان ئەوەیە بۆ خوای گەورە بیرت دەخاتەوە کەوا ئێمەی بەندە لە چ کاتێک لەقیامەت دەژین ئەگەر زانیت خوای پەروەردگار کێیە {يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ (Al-Mutaffifin :6) بۆ خوای ئەرزو ئاسمانەکان ، بۆیە یەکێک لەو هۆکارانەی کە زۆر زۆر خەوفی خوای گەورە لە دڵمان درووست دەکات ئەویش بریتیە لە گەورەیی خوای پەروەردگار لەدڵەکان خەڵک بۆ لە طاغوت ئەترسێ سەیری گەورەیی و هێزوو دەسەڵاتی دەکاتن بۆیە لێی دەترسێ دەی ئەوانە لە چاو خوایەکی خاوەن سیفاتی[الجبار- العزیز- القهار......هتد چیە، ئەبێت چەند ئەو سیفاتانە ترسی خوای لە دڵەکانمان دروست کردبێ .

بۆیە ئەوەی زۆر کێشەی بۆ ئەم ئوممەتە دروست کردبێ لە بابی تەوحیددایە بۆیە ئێمە چەند ساڵە ئەم تەوحیدە دەخوێنین **[ولا نمارث توحيد، ولا نعيش مع توحيد]** بەڵێ برای وا هەیە عەقیدەی **طحاويتي** هەموو خوێندووە لەوانەیە مەتنەکەشی لەبەر بێ بەڵام ئەگەر شەو دەستێکی لەپشت بدەی لەوانەیە رووحی دەرچێ لە ترسان، بەڵێ لەوانەیە{ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ (Aali Imraan :175)ی خوێندووە بەڵام خەوفەکە لە زمانیەتی لەدڵی دانیە بۆیە دەبینی تووشی هەرترسێک ئەبین خوامان لەبیر ئەچێتەوە وەک ئەو چیرۆکەی کەوا مامۆستایەک باسی[لا اله الا الله]ی دەکرد تووتیەکی هەبوو لەگەڵ خۆی دەیبرد ئەوەندە ئەیوت لا اله الا الله تووتیەکەش ئەیوتەوە هەتا رۆژێک پشیلەیەک خواردی وەک پشیلەکانی ئەمرۆ ئەمان خۆن ئێمە زۆر بەقوەت باسی لا اله الا الله دەکەین زۆر عەجیب باسی قورئان دەکەین بەڵام کاتێک پشیلەیەک

دەمان خوات لەجیاتی بلێین لا اله الا الله بەس هاوار دەکەین جا مامۆستاکە زۆر گریا قوتابیەکان ووتیان مامۆستا بۆ وا دەگریت ئێمە تووتیەکی جوانتروو باشترت بۆ دێنین ووتی نا وەللە من بۆ ئەوە دەگریم ئێمە کەوەک و ئەو تووتیە لا اله الا الله بەس بەزمان فێربین.

بۆیە بەراستی زوڵمە لەسەر زەوی هەرشتێکمان بەسەر بێ بگرین وبێتاقەت بین کاتێک دەگیرێین یان دەکوژرێین یان فەقیردەبین وبرسی دەبین تاقی دەکرێینەوە هیچ شتێک لەوانە زەرەری نیە بۆ ئێمە هەر هەمووی رەحمەتی خودایە بەشەرتێک کەوا سەبری لەسەر بگرین بەشەرتێک ئێمە رازیبین بەخودای پەروەردگار بۆیە بەم شێوەیە لەقورئان بگەین وبیخوێنین رۆژ بەرۆژ زۆر عەجیب لەخودای گەورە نزیک دەبینەوە جا ئێمە با لەوانە نەبین دووای ئەو هەموو قورئان خوێندنە کاتێک ناخۆشیمان دێتە سەر رێ .

وەک ئەو کابرایەی کە [ابن القيم] باسی دەکات کاتێک لەسەردەمی تابعین گەنجێکی **حافض** قورئان لە رێگادا دەرۆی ئافرەتێکی نەسرانی بینی یەک سەر ئافرەتەکە چوە دڵیەوە چەند قسەیان بۆکرد وازبێنێ دەزانن بۆچی لەبەر ئەوەی ئەم قورئانە لەمێشکیدایە تەنها بۆیە جیاوازی علمی خوارج وصحابة چی بوو تەنها یەک خاڵ بوو ئەویش علمی صحابە لە قورگیان چووە خوارەوە خەوفی درووست کرد داخلی دڵیان بوو بەڵام علمی خوارج تەنها لە مێشکیان و زمانیان بوو داخلی دڵیان نەبوو خەوفی خودا درووست بکا بۆیە صحابە بوونە موتتەقی خەواریجیش بوون بە باغی بوون بەو زاڵمەی کەوا خوێنی صحابەو زۆر کەسیش برێژن پەنا بەخودای گەورە، ئەم گەنجە لەگەڵ ئەوەی هەموو قورئانی لەبەر بوو ئەو ئایەتەشی لەبەربوو کە الله دەفەرمووێ{ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ (Aali Imraan :14) بەڵام ئەم ئایەتانە کاتێک دەبنە شیفاء بۆ دڵی ئێمە کەلەسەری بووەستین بۆیە زۆرجار دەڵێین مەرۆ بەسەری دا سێ رۆژ چوار رۆژ خەریکی بە الله پێت ئەفەرمووێ گەورەترین فیتنە لەسەرتۆ لەسەر دینت بۆ ئەوەی دڵت بۆگەن بێت ئیستیفادە لە دوونیاو لەو قورئانە نەکەی هەمووشت لەمێشکی بێ ئەگەر ئاگات لەو فیتنانە نەبێت یەکەم فیتنەش فیتنەی ئافرەتە ئەم فیتنەیە گەورەترین فیتنەیە لەسەر گەنج ، چەند ئافرەت ئەڵێن پیاوەکانمان سەیری فیلمی رووت ئەکەن پێم ووتوە برۆ ژنی دووەم بێنە بەس وازبێنە ئەڵێ ناتوانم وازبێنم پەنا بەخوا لەبەر ئەوەی ئەم دڵەی خۆی وا پەروەردە نەکرد بەم قورئانە بۆی ببێتە شیفا وەک ئەوگەنجەی سەردەمی تابعین بزانن کە گەرانەوە ووتیان ئەی گەنج تۆ چیت لەو قورئانە کرد سبحان الله فەرمووی یەک ئایەتم لەبیر نەماوە ئێستا هەموویم لەبیر چووە.

[ابن القيم] دەفەرمووێ لە گەورەترین نیعمەتی ئەو قورئانە بەتایبەت ئەو سورەتەیە [الفاتحە]یە شیفایە بۆ شەهەوات بۆ شبوهات ئێستا بە گشتی موسوڵمانان غەرقی شەهەوات و شبووهات هاتوونە، جاکاتێک قورئان ئەخوێنین و حیفضی دەکەین لەبەر یەک هۆکارە ئەویش بۆ ئەوەی زوو دەلیلەکم بیربێتەوە لەقورئان بۆ ئەوەی وەک و دەلیل پێی بێت ئەوە هەدەفی حیفضةکتبة وەالله هەدەفی گەورە لەقورئان الله سبحان وتعالی دەفەرمووێ { أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ (Muhammad :24) هەرکاتێک ئینسان تەدەبووری هەبوو بەرامبەر ئایەتەکان ئەوا ئەوکەسە موتتەقیە ئەوکەسە خاشیعە ئەوکەسە موخلیصة ئەوکەسە ئەهلی قیامەتە بۆیە هەرکەسێک تەدەبوری ئەو ئایەتە بکات { وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى An-Naazi'aat :40 قەد موخالەفەی دەکات قەد شوێنی هەواو ئارەزووی دەکەوێت، وە ئەگەر سەیری ئەم ئایەتە بکەین الله دەفەرمووێ{وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا } {فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى} An-Naazi'aat :39 کابرایەک بێت ئیشارە بکات ژیانی دونیا بەسەر ئاخیرەت هەڵبژێرێ لە کاتێک پێناسەی دونیا چیە [ابو هریرە]ئەفەرمووێ رۆژێک لەگەل پێغەمبەر[صلی الله علیه وسلم] ئەرۆیشتین ئەڵێ گوێدرێژێکی تۆپیومان بینی پێغەمبەر فەرمووی کێ بەدرهەمێک ئەیەوێ کە ئێستا چەندین خۆی ئەکاتە قوربانی بۆ دونیایەکەی ئینجا فەرموویان ئەوە کەس بە زیندوویی نایەوێ چ جای ئەوەی بە مردوویی کێ دەیەوێت ئینجا با ئێمە ئەو قورئانە بکەینە شیفای دڵەکانمان بیکەین بەرەحمەت بۆخۆمان.

**گریان لە ترسی اللە**: ئینجا الله دەوامەمان بات باسی گریان بکەین بە هیچ جۆرێک جێگای قەبوڵ نیە کەوا کەسێک ئەهلی قورئان بێتوو نەگریەت ئەمە **موطلقة** دەبێ تۆ هەفتانە گریانت هەبێ ئەگەرنا وەاللەی با لەو دڵە بترسین کە لەترسی خودای گەورە ناگری وەاللەی با ئەو دڵە موراجەعەی خۆی بکاتەوە ئەگەرنا بەیانی نزیکە ئەم دڵە هەڵگەڕێتەوە پەنا بەخوا، چونکە گریان وەک تیزابە ژەنگی سەر دڵ و حوببی دونیاو پۆخڵەواتی ئەو دڵەی ئێمە هەمانە ئەو دڵە ڕەقەی ئێمە هەمانە کەوا ئێستا بە چاوی خۆمان دەیبینین دەبێت بیشۆینەوە بۆیە ئینسان نابێت بەمەدحی خەڵک لە خۆبایی بێت چونکە کەلامی خودا زۆر لەوە گەورەترە کابرا بڵێت بۆ ڕیا ناگریم وەالله ئێستا ئێمە دڵمان ڕەقە بۆیە ئێستا ناگرین بەڵام ئێمە کە ناگرین زۆر کەس وا بڵێن لەبەر ڕیایە ناوەالله لەبەر دڵی بۆگەنمانە لەبەر ئەوەی دڵەکانمان ڕق بووە بەهۆی حوببی دونیا بەهۆی ئەوەی کە صحابە ئەو صیدقەی هەیان بووە ئێمە نیمانە، نوح لەچیەوە هاتووە لەگریانەوە هاتووە ٩٥٠ ساڵ بەس گریاوە گریانی پێغەمبەرمان[صلی

صلى الله عليه وسلم] وە گریانی ئەبوبەکر بەس بەگریانەکەی ڕۆژانە خەڵک موسوڵمان بوونە کاتێک کە قورئانی دەخوێند پێغەمبەر کاتێک کە نەخۆش بوو فەرمووی یا عائیشە با ئەبوبەکر پێژنوێژی بۆ موسوڵمانان بکات ووتی ئەی پێغەمبەری خودا ئەبوبەکر پیاوێکی دل نەرمە ناتوانێ پێژنوێژی بکات فەرمووی یا عائیشە موناقەشەی پێغەمبەران مەکە با ئەبوبەکر پێش کەوێت بەڵام ئەبوبەکر نازانێ چی دەخوێنێت ، هەروەها ئیمامی عومەر کاتێک ئەم ئایەتە دەخوێنێت الله دەفەرمووێ{**قَالَ إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ** (Yusuf :86) شەکوای خۆی دەکات تاوەک و دوو خەتی ڕەشی لێ درووست دەبێ، خوێنەری خۆشەویستم ئایا بیستووتە ماڵێک بەگەورەو بچوکیانەوە لەترسی خوا پێکەوە بگرین ؟کەمن ناوم ناوە [ماڵێک لەگریان] ئەویش مالی خەلیفەی دادپەروەری ڕاشید [عومەری کوری عبدالعزیز]ە ئەمە چۆن بووە ئەبی مودود دەگێرێتەوە ڕۆژێکیان عومەری کوری عبدالعزیز قورئانی دەخوێند گەیشتە ئەم ئایەتەی کە دەفەرمووێ{**وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِنْ قُرْآنٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا** (Yunus :61) زۆر بوکول دەستی کرد بەگریان بەجۆرێک هەموو ماڵەکە گوێیان لێبوو **فاطمەی** خێزانی هات لەلای دانیشت وەک ئەو دەستی کرد بەگریان و هەموو کچ وکورەکانی کە لەوێبوون دەستیان کرد بەگریان لەوکاتەدا [عبدالملک]ی کوری هات بەژووورداو رووی کردە باوکی و لێی پرسی باوکە گیان ئەوە بۆچی دەگری عومەریش ووتی خێرە کوری خۆم باوکت ئاواتە خوازبوو نە دنیای بناسیایەو نە دنیاش ئەوی بناسیایە دەی وەاللەی کوری خۆم ئەترسم لەناوبچم زۆر دەترسم بخرێمە نێو ئاگری دۆزەخەوە.

وە سەیری گریانی ئیمامی عوسمان بکەن وە سەیری ئاخیر دەقەی ژیانی بکەن کاتێک کە شەهید دەکرێت خوێنی دەکەوێتە سەر ئەم ئایەتەی کە خودای گەورە دەفەرمووێ **فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ** (Al-Baqara :137) خوای گەورە کافیە بۆ هەموو زاڵمێکە کەوا خوێنی موسوڵمانان دەڕێژێ ئەمە دەلیلە لەسەر ئەوەی کەلەسەرچی ژیان وە لەسەر ئەوەش مردن ئیمامی عوسمان چونکە لەسەر قورئان ژیا چونکە یەکێک لەوکەسانە بوو کە مەشهور بوو بەوەی لە هەفتەیەکدا خەتمی قورئانی دەکرد هەتا وەفاتی کرد.

## جا لەکۆتاییدا داوامان لە خودای قورئان وایە بە ئیسمی عەزەمی یارەبی قورئان بکەیە شیفا بۆ دڵەکانمان خودایە بۆ خاتری ناوی جوانت دڵمان

نەرمتر كەيت لە ئاو{اللهم ارحمني بالقرءان واجعلة لي إماما ونورا وهدي ورحمة اللهم ذكرني منه ما أنسيت وعلمني منه ماجهلت وارزقني تلاوته أناء الليل وأطراف النهار واجعله لي حجة يا رب العالمين ،، ئامين }

